

# عومره

## به بەڵگەی قورئان وسوننەت وئاساری سەلەف

پوختەکراوە لە کتێبی (مناسك الحج والعمرة في الكتاب والسنة وآثار السلف)




زانای فەرموودەناس

محمد ناصرالدين الألباني

پوختەکردن ووەرگێڕانی

عثمان أحمد حاتم

# عومره

## به بەڵگەی قورئان وسوننەت وئاساری سەلەف

پوختەکراوە لە کتێبی (مناسك الحج والعمرة في الكتاب والسنة وآثار السلف)


زانای فەرموودەناس

محمد ناصرالدين الألباني

پوختەکردن ووەرگێڕانی

عثمان أحمد حاتم



شعبان – ١٤٤٣

قال الله ﷻ : ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ ١٩٦﴾(البَقَرَة).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قالَ : ((العُمْرَةُ إلى العُمْرَةِ كَفّارَةٌ لِما بَيْنَهُما ، والحَجُّ المَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزاءٌ إلّا الجَنَّةُ)).مُتَّفق عَلَيْهِ



بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على عبده ورسوله محمد بن عبدالله ، وعلى آله وأصحابه ومن سلك سبيله واهتدى بهداه إلى يوم الدين ؛ أما بعد:

ئەم نوسراوەم كورت وپوخت كردووە لە كتێبی (مناسك الحج والعمرة في الكتاب والسنة وآثار السلف)ی زانای فەرموودەناس محمد ناصرالدین الألبانی رَحِمَهُ ٱللَّهُ پاشان وەرمگێڕاوە ، لەبەر ئەوەی كتێبەكە بۆ باسی حەج وعومرە پێكەوە نوسراوە هەوڵمداوە حوكمی عومرەی لێ دەربهێنم وزۆرجار وشەی (عمرە)م لە نێوان دووكەواندا بەو شێوەیە زیاد كردووە ، ئەو كەسەی عومرە

به‌جێده‌هێنێت ئه‌گه‌ر ڕه‌چاوی خاڵه‌کانی ئه‌م نوسراوه بکات به وردی ، به‌و شێوه‌یه عومره‌که‌ی به‌جێهێناوه که له ئایه‌ته‌کانی قورئان وفه‌رمووده صه‌حیحه‌کانی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ وئاساری سه‌له‌فدا هاتووه ، که ئه‌وه مه‌رجێکی قه‌بوڵ بوونی کرده‌وه‌یه موسڵمان چاو له پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ بکات وشوێنی بکه‌وێت ، ومه‌رجه‌که‌ی تر به ئیخلاصه‌وه ئه‌نجامدان ، ودوورکه‌وتنه‌وه‌یه‌تی له ڕیبا وبه‌رچاوی خه‌ڵك وبه ته‌نها ئه‌نجامدانی کرده‌وه له‌به‌ر خودا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى .

عثمان أحمد حاتم
١٨ . شعبان . ١٤٤٣
٢١ . آزار . ٢٠٢٢

  

## ئەنجامدانی ئەم کردارانە ئاساییە

پێویستە لەسەر بانگخواز کارئاسانی بکات بۆ خەڵك بەگشتی وبۆ حاجییان (عومرەکاران) بە تایبەتی ، چونکە ئاسانکاری بنەمایەکە لە بنەماکانی شەریعەی ئاسانی ئیسلام ، کە ئەوە زانراوە ، هەتاکو ئەوەی دەقێك نەبێت پێچەوانەی بێت ، ئەگەر دەقێك هەبوو ئاسانکاری بە ڕەئی دروست نییە ، ئەمە هەڵوێستی مامناوەندی دادگەرە کە پێویستە لەسەر هەموو بانگخوازێك وابەستەی بێت ، دوای ئەوە قسە ونارەزای خەڵك ئیعتباری نییە بڵێن : توندی کردەوە ، یان شلی کردەوە .

وهەندێ کردەوە هەیە دروستە ، بەڵام حاجییەکان (عومرەکاران) ئیحراج دەبن لە ئەنجامدانی لەبەر هەندێك فەتوا کە

هەندێك خەڵك داویانە وپێچەوانەی ئەو بنەمایە كە پێشتر ئاماژەی بۆ كرا ، بە پێویستم زانی تێبینییان لەسەر بدەم :

١ . خۆشۆردن ئەگەر بۆ لەشگرانیش نەبێت ، لەگەڵ دەست خستنە نێو قژ وسەریش دروستە ، چونكە ئەوە لە هەردوو صەحیحەكە وجگە لەوانیش لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ جێگربووە لە فەرموودەی ئەبوئەیوبەوە رضي الله عنه .

٢ . خوراندنی سەر ئەگەر هەندێك تاڵە قژیشی لێ بكەوێت ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی ئەبوئەیوب كە پێشتر ئاماژەم بۆ كرد ، وئەوە بۆچوونی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە رحمه الله .

٣ . كەڵەشاخ كردن ئەگەر بە تاشینی مووی ئەو شوێنەش بێت كە كەڵەشاخەكەی بۆ دەكرێت دروستە ، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ كەڵەشاخی كردووە لە ناوەڕاستی سەری لە كاتێكدا

لە ئیحرامدا بووە ، وکەڵەشاخ بەبێ تاشینی ئەو شوێنە ناکرێت ، ئەوەش دیسان بۆچوونی ئیبن تەیمییەیە ، وحەنبەلییەکانیش ئەو بۆچوونەیان هەیە ، بەڵام فیدیەیان لەسەر ئەو کەسە واجب کردووە ، وبەڵگەیان نییە ، وڕەت دەکرێتەوە بەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەڵەشاخی کردووە ، چونکە ئەگەر فیدیەی دابا ڕاوییەکە دەیگێڕایەوە ، بەڵام کە تەنها باسی کەڵەشاخ کردنی دەکات بەبێ باسی فیدیە ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فیدیەی نەداوە ، ئەوەی صەوابە قسەکەی ئیبن تەیمییەیە .

٤ . بۆن کردنی ڕەیحانە ، ولادانی نینۆك ئەگەر شکا ئاساییە ، وکۆمەڵێك ئاسار لەسەر ئەوە هاتووە .

٥ . چوونە ژێر سێبەری چادر یان پۆشاك لەسەر سەری بەرز کرابێتەوە ، لەبەر ئەوەی جێگیربووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ ،

وهەروەها سێبەرکردن به شتێك که هەڵبگیرێت که لـه کۆندا هەبووه ولەم سەردەمەش به چەتر وئۆتۆمبێل ئەگەر لـه ژوورەوه دابنیشێت ، وپێویست کردنی فیدیه توندییەکه بەڵگەی لەسەر نییه ، بەڵکو تێڕوانینی دروست جیاوازی ناکات لـه نیوان چادر که لـه سوننەتدا جێگیربووه وچەتر وهاوماناکانی ، ئەوه ڕیوایەتێکه لـه ئیمام ئەحمەدەوه وەك لـه (منار السبيل)(١/٢٤٦) هاتووه ، ئەوەی هەندێك کۆمەڵ ئەنجامیدەدەن لـه لابردنی سەقفی ئۆتۆمبیل توندی وڕۆچوونێکه خودای پەروەردگاری جیهان ڕوخسەتی پێنەداوه .

٦ . بەستنی ناوقەد به کەمەربەند ، بەستنی لـه کاتی پێویستدا ئاساییه ، وهەروەها لـه دەستکردنی ئەنگوستیلە وەك لـه هەندێك ئاساردا هاتووه ، ولـه دەستکردنی سەعات ، ولـه چاوکردنی چاویلکه ، ولـه ملکردنی جزدانی پارە ، هەموو ئەو شتانه دەچێته ژێر ئەو بنەمایەی باسکرا ، لـەگەڵ ئەوەی هەندێك فەرموودەی

پێغەمبەری خودا ﷺ وئاساری هاوەڵان بەڵگەیە لەسەری ، وخودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ١٨٥﴾ (البَقَرَة).

واته : خودا ئاسانکاری بۆ ئێوه دەوێت ، وخودا نایەوێت حوکم وئاینتان لەسەر قورس وگران بکات ؛ وسوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکان .

  

## كاتی ئیحرامكردن

١ . سوننەتە بۆ ئەو كەسەی دەیەوێت حەج یان بە تەنها عومره ئەنجامبدات خۆی بشوات بۆ ئیحرام كردن ، ئەگەر ئافرەتیش بێت ولە سوڕی مانگانە یان زەیسانیشدابێت (الحیض والنفاس).

٢ . پاشان پیاو هەرپۆشاكێكی بوێت دەیپۆشێت كە لەسەر ئەندامەكانی لاشەی نەبڕابێت كە لای فەقیهەكان پێی دەڵێن : نەدووراو (غیر المخیط) ، پارچەیەك بۆ پۆشینی بەشی سەرەوەی لاشەی (رداء) وپارچەیەك بۆ پۆشینی بەشی خوارەوەی (إزار) ، یان هاوشێوەی ئەوانە دەپۆشێت ، ونەعل لە پێدەكات كە بریتییە لە هەموو ئەوەی لە پێدەكرێت بۆ پاراستنی پێیەكان ، وقولەپێكان دانەپۆشێت .

٣ . کڵاو وعەمامە وهاوشێوەیان کە ڕاستەوخۆ سەردادەپۆشێت لەسەر ناکرێت ، ئەمە بۆ پیاو ، بەڵام ئافرەت هیچ لە پۆشاکە شەرعییەکەی لەبەر داناکەنێت ، بەڵام نیقاب وپەچە ودەستەسڕ لەسەر ڕوخساری نابەستێت ودەستکێش لە دەست ناکات ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((لا يَلْبَسُ المُحْرِمُ القَمِيصَ ، ولا العِمامةَ ، ولا البُرنُسَ ، ولا السراويلَ ، وَلا ثَوْبًا مَسَّهُ وَرْسٌ وَلا زَعْفَرانٌ ، وَلا الخُفَّيْنِ إِلّا أَن لا يَجِد النَّعْلَيْن [فليلبَسِ الخُفَّينِ] ، وقالَ : لا تنتقِبُ المرأةُ المَحْرمة ولا تَلبسُ القُفّازَينِ)).

واتە : ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە قەمیس وعەمامە وئەو کراسەی کڵاوەکەی لەگەڵ خۆیدایە وشەرواڵ لەبەر ناکات ، وهەروەها ئەو پۆشاکەی بۆنی وەرس وزەعفەرانی لێدرابێت ، وخوف لە پێ ناکات کەسێك نەبێت نەعلی دەست نەکەوێت

خوف له پێ بكات[1]، وفه‌رمووی : ئه‌و ئافره‌ته له ئیحرامدایه نیقاب ناكات وده‌ستكێش له ده‌ست ناكات .

ودروسته ئافره‌ت ڕوخساری داپۆشرێت به‌شتێك وه‌ك سه‌رپۆش وعه‌با ، ده‌یدات به‌سه‌ریدا ، وده‌یهێنێته خواره‌وه بۆ سه‌ر ڕوخساری ، ئه‌گه‌ر به‌ر ڕوخساریشی بكه‌وێت ، به‌ڵام له‌سه‌ری نایبه‌ستێت ، ئه‌وه بۆچوونی ئیبن ته‌یمییه‌یه رحمه الله .

٤ . وبۆی هه‌یه پۆشاكی ئیحرام پێش شوێنی دیاریكراو بۆ ئیحرام كردن (المیقات) له‌به‌ر بكات ، ئه‌گه‌ر له ماڵه‌كه‌ی خۆیشیه‌وه بێت ، پێغه‌مبه‌ری خودا صلى الله عليه وسلم وهاوه‌ڵانی به‌وشێوه‌یان كردووه ، وئه‌مه

(١). شێخی ئیسلام ئیبن ته‌یمیه له (منسك)كه‌یدا ده‌ڵێت : پێویست نیه له خوار قوله پێكانییه‌وه ببڕێت ، چونكه پێغه‌مبه‌ری خودا صلى الله عليه وسلم سه‌ره‌تا فه‌رمانی به بڕینی كرد ، پاشان دوای ئه‌وه له عه‌ره‌فات ڕوخسه‌تیدا به‌له پێكردنی شه‌رواڵ بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی ئیزاری ده‌ست ناكه‌وێت ، وڕوخسه‌تیدا به‌له پێكردنی خوف بۆ ئه‌و كه‌سی نه‌عی ده‌ست ناكه‌وێت ، ئه‌وه بۆچوونی صه‌حیحی له‌و دوو مه‌زهه‌به‌ی زانایان هه‌یانه .

ئاسانكارییه بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی حه‌ج (عومره) به فڕۆكه به‌جێده‌هێنن ، وناتوانن پۆشاكی ئیحرام له میقاته‌وه له‌به‌ر بكه‌ن ، ده‌توانن به پۆشاكی ئیحرامه‌وه سه‌رفرۆكه‌كه بكه‌ون ، به‌ڵام پێش میقات ئیحرام ناكه‌ن به ماوه‌یه‌كی كه‌م نه‌بێت ، بۆ ئه‌وه‌ی میقات تێنه‌په‌ڕێنن وئیحرامیان نه‌كردبێت .

٥ . وبۆی هه‌یه لاشه‌ی چه‌ور وبۆن خۆش بكات به هه‌رجۆره بۆنێك كه ده‌یه‌وێت ، بۆنی هه‌بێت وڕه‌نگی نه‌بێت جگه له ئافره‌ت كه بۆن خۆشكردنیان ڕه‌نگی هه‌یه وبۆنی نییه ، هه‌موو ئه‌مانه پێش ئه‌وه‌ی نییه‌تی ئیحرام بهێنێت له میقات ، دوای ئه‌وه حه‌رام ده‌بێت.

  

## ئیحرام کردن ونییەت هێنانی

٦ . ئەگەر گەیشتە میقات واجبە لەسەری ئیحرام بكات ، وبە تەنها نییەتی دڵ بەس نییە ، کە ویستی حەج (یان عومرەی) هەبێت ، چونکە لەو کاتەوە لە وڵاتی خۆی دەرچووە نییەتەکەی لە دڵدا هەبووە ، بەڵکو پێویستە گوتەیەك یان کردارێك بكات بۆ ئەوەی ئیحرام بكات ، ئەگەر تەلبییەی کرد ونییەتی ئیحرامی هەبێت ئیحرامەکەی بە کۆڕا دادەمەزرێت .

٧ . بە زمانی هیچ شتێك ناڵێت پێش تەلبییە کردن ، وەك ئەوەی دەڵێن : پەروەردگارا من دەمەوێت حەج یان عومرە بەجێ بهێنم بۆمی ئاسان بکە ولێم وەربگرە ... لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ نەهاتووە ، وئەمە وەك بە زمان گوتنی نییەتە لە

دەستنوێژ ونوێژ ورِۆژوو ، هەموو ئەوانە لە بیدعە داهێنراوەكانن ، وزانراوە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((...فإنَّ كلَّ محدثةٍ بدعةٌ وكلَّ بدعةٍ ضلالةٌ وَكلُّ ضلالةٍ في النّارِ)).

واتە : بێگومان هەموو داهێنراوێك بیدعەیە وهەموو بیدعەیەك گومرِاییە ، وهەموو گومرِاییەك لە ئاگردایە .

  

## شوێنەکانی ئیحرام کردن (میقاتەکان)

٨ . شوێنەکانی ئیحرام کردن پێنج شوێنن : (زوالحولەیفە ، وجوحفە ، وقەرنی مەنازل ، ویەلەملەم ، وزاتی عرق) ئەو شوێنانە بۆ خەڵکەکەی خۆی وئەو کەسانەیە بەوێدا تێدەپەڕن کە خەڵکی ئەو شوێنانەنین ، بۆ ئەو کەسەی ویستی حەج یان عومرەکردنی هەبێت ، وهەرکەسێك ماڵی لەو شوێنانە نزیکتربوو لە مەککەوە لە ماڵەکەی خۆیەوە تەلبییە دەکات ، وخەڵکی شاری مەککە لە مەککەوە تەلبییە دەکەن .

زوالحولەیفە : شوێنی تەلبییەکردنی خەڵکی مەدینەیە ، کە گوندێکە شەش یان حەوت میل لە مەدینەوە دوورە ، ودوورترین شوێنی ئیحرام کردنە لە مەککەوە ، لە نێوانیاندا دە قۆناغ کەمتر

یان زیاتر هەیە بەپێی جیاوازی ڕێگاکان ، چونکە بۆ مەککە چەند ڕێگەیەك هەیە ، ئەوە بۆچوونی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەیە ، وپێی دەگوترێت شیوی عەقیق (وادي العقيق) ، ومزگەوتەکەی پێی دەگوترێت : (مزگەوتی الشجرة) ، وبیرێکی تێدایە خەڵکی نەفام پێی دەڵێن : بیری عەلی ، لەبەر ئەوەی گومانیان وایە عەلی رضي الله عنه شەڕی لەگەڵ جندا کردووە لەو شوێنە ، کە درۆیە .

جوحفە : گوندێکە ماوەی نێوانی ومەککە نزیکەی سێ قۆناغە ، وشوێنی ئیحرامکردنی ئەهلی شام ومیسر وئەهلی مەدینەیە ئەگەر لە ڕێگەیەکی ترەوە بڕۆن بۆ مەککە ، ئیبن تەیمییە دەڵێت : شوێنی ئیحرامکردنی ئەو کەسانەیە لە لای ڕۆژئاواوە حەج (عومرە) دەکەن کە ئەهلی شام ومیسر وناوچەکانی تری ڕۆژئاوا دەگرێتەوە ، کە ئەمڕۆ کەلاوەیە ، لەبەر ئەوە خەڵك لە شوێنێك پێش ئەوە ئیحرام دەکەن پێی دەگوترێت "رابغ".

قەرنی مەنازل : وپێی دەگوترێت (قرن الثعالب) ماوەی ڕۆژوو وشەوێك لە مەككەوە دوورە وشوێنی ئیحرام كردنی ئەهلی نەجدە .

یەلەملەم : شوێنێكە دوو شەو ڕێگا لە مەككەوە دوورە ، ونێوانیان نزیكەی سی میلە ، وشوێنی ئیحرامكردنی ئەهلی یەمەنە .

وزاتی عرق : شوێنێكە لە بیابان ، وسنوری جیاكەرەوەی نێوان نەجد وتهامەیە ، دووری نێوان ئەم شوێنە ومەككە چل ودوو میلە ، وشوێنی ئیحرام كردنی ئەهلی عێراقە .

٩ . ئەگەر ویستی ئیحرام بكات دەڵێت : ((لبيك اللَّهمَّ بعمرة)).

  

## مه‌رجدانان

١٠ . ئه‌گه‌ر ویستی ته‌لبییه‌که‌ی مه‌رجدار ده‌كات لای په‌روه‌ردگاری له‌ ترس ئه‌وه‌ی شتێك بێته‌پێش له‌ نه‌خۆشی یان ترس ، وئه‌وه‌ی كه‌ پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ فێری كردوون ده‌یلێت : ((اللَّهمَّ مَحِلِّي حيثُ حبَسْتَني)) ، ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی كرد ، وڕێگیری لێكرا یان نه‌خۆشكه‌وت ، دروسته‌ بۆی له‌ ئیحرام ده‌ربچێت وحه‌ڵاڵ بێته‌وه‌ له‌ حه‌ج یان عومره‌كه‌ی ، وسه‌ربڕینی ئاژه‌ڵ ، وحه‌ج كردنی له‌ ساڵی ئاینده‌ له‌سه‌ر نییه‌ ، ئیللا ئه‌گه‌ر حه‌جی فه‌رزی ئیسلامی له‌سه‌ربێت ئه‌وكاته‌ پێویسته‌ قه‌زای بكاته‌وه‌ .

١١ . ئیحرام كردن هیچ نوێژێكی تایبه‌تی نییه‌ ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر پێش ئیحرام كردن كاتی نوێژی به‌سه‌ردا هات ، ونوێژی كرد پاشان دوای نوێژه‌كه‌ی ئیحرام بكات ، پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ له‌و كرده‌وه‌دا پێشه‌نگییه‌تی ، چونكه‌ دوای نوێژی نیوه‌ڕۆ ئیحرامی كردووه‌ .





## نوێژکردن لە شیوی عەقیق

١٢ . هەرکەسێك شوێنی ئیحرام کردنی زوالحولەیفە بوو سوننەتە لە شیوی عەقیق نوێژ بکات نەلەبەر تایبەت بوونی بە ئیحرام کردن ، بەڵکو لەبەر تایبەتی شوێنەکە وبەرەکەتی ، بوخاری لە عومەرەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت : ((سَمِعْتُ رسولَ الله ﷺ بوادِي العَقِيقِ يقولُ : أَتانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِن رَبِّي ، فَقالَ : صَلِّ في هذا الوادِي المُبارَكِ ، وقُلْ : عُمْرَة في ، وفي رواية : عُمْرَة وحَجَّةٍ)).

واتە : گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو لە شیوی عەقیق دەیفەرموو : ئەمشەو کەسێك هات بۆ لام لە پەروەردگارمەوە وفەرمووی : نوێژ بکە لەم شیوە پیرۆزە ، وبڵێ : ((عُمْرَة في حَجَّةٍ)) ولە ڕیوایەتێکدا : ((عُمْرَة وحَجَّةٍ)).

وئیبن عومەر رضي الله عنهما ((عَنِ النبيِّ ﷺ : أنَّه رئي ، وفي رواية : أُرِيَ وهو مُعَرَّسٍ بذِي الحُلَيْفَةِ ببَطْنِ الوادِي ، قِيلَ له: إنَّكَ ببَطْحاءَ مُبارَكَةٍ)).

واتە : لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەگێڕێتەوە کە بینی ، یان پیشانیدرا ، لە کاتێکدا لە زولحولەیفە لە ناوجەرگەی شیوەکە لەگەڵ کاروانەکەی پشوویدابوو ، پێی گوترا : بێگومان تۆ لە پانتایی شیوێکی موبارەکدایت .

  

## تەلبیەکردن ودەنگ بەرز کردنەوە

١٣ . پاشان ڕوو دەکاتە قیبلە بەپێوە تەلبیە بە عومرە دەکات ودەڵێت : ((لبيك اللَّهمَّ بعمرة)).

١٤ . وتەلبیە دەکات بە تەلبیەی پێغەمبەری خودا ﷺ :

أ . ((لبيكَ اللهمَّ لبيكَ ، لبيكَ لا شريكَ لكَ لبيكَ ، إنَّ الحمدَ والنعمةَ لكَ والملكَ لا شريكَ لكَ))، وهیچی تری بۆ زیاد نەدەکرد.

ب . و((لبَّيكَ إلهَ الحقّ)) لە تەلبیەی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو.

١٥ . وابەستە بوون بە تەلبیە کردنی پێغەمبەری خودا ﷺ باشترە ، ئەگەرچی زیادکردنی دروستە ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری

خودا ﷺ ئیقراری خەڵکی کردووە کە زیادەیان کردووە لە تەلبیەدا ودەیانگوت : (لبَّيْكَ ذا المَعارِجِ ، لبَّيْكَ ذا الفواضِلِ).

وئیبن عومەر رضي الله عنهما لە تەلبیەدا ئەمەی زیاد دەکرد : (لبَّيْكَ وسعديْكَ ، والخيرُ بيديْكَ ، والرَّغْباءُ إليكَ والعملُ).

١٦ . وفەرمان دەکرێت بەو کەسەی تەلبیە دەکات دەنگی بەرز بکاتەوە بە تەلبیە کردن ، لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە دەفەرموێت : ((أتاني جبريلُ فأمَرني أنْ آمُرَ أصحابي ومَنْ مَعي أن يرفَعوا أصواتَهم بالتلبيةِ)).

واتە : جبریل عليه السلام هات بۆ لام فەرمانی پێکردم کە فەرمان بە هاوەڵانم وئەوکەسانە بکەم لەگەڵمدان دەنگیان بە تەلبیەکردن بەرز بکەنەوە .

لەبەر ئەوە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە حەجەکەیدا لە کاتی تەلبیەکردندا بە هاوارکردن هاواریان دەکرد ، بۆیە ئەبوحازم دەڵێت : کاتێك ئیحرامیان بکردایە نەدەگەیشتنە (الروحاء) دەنگیان گڕدەبوو ، وبە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلى مُوسى** عليه السلام **هابِطًا مِنَ الثَّنِيَّةِ ، وله جُؤارٌ إلى اللهِ بالتَّلْبِيَةِ**)).

واتە : وەك ئەوەی دەڕوانمە پێغەمبەر موسا عليه السلام لە ڕێگایەك لە شاخێکەوە دادەبەزێت ، ودەنگی بە تەلبیەکردن بۆ لای خودا سبحانه وتعالى بەرز دەکاتەوە .

١٧ . وئافرەتانیش لە دەنگ بەرز کردنەوە بۆ تەلبیە کردن وەك پیاوانن لەبەر گشتگیری دوو فەرموودەیەی پێشوو ، دەنگیان بەرز دەکەنەوە ئەگەر لە فیتنە نەترسن ، ولەبەر ئەوەی عائیشە رضي الله عنها

دەنگی بەرز دەكردەوە وپیاوانیش دەیان بیست ، ئەبو عەتییە رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت : گوێم لە عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا بوو دەیگوت : (**إنِّي لَأعلَمُ كيْفَ كانَتْ تَلبيةُ رسولِ اللهِ ﷺ ، ثم سَمِعتُها تُلبي بَعْدَ ذَلكَ : لبَّيكَ اللَّهمَّ لَبَّيكَ...إلخ**).

واتە : گوێم لە عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا بوو دەیگوت : من دەزانم پێغەمبەری خودا ﷺ چۆن تەلبیەی دەكرد ، پاشان گوێم لێ بوو دوای ئەوە دەیگوت : (**لبَّيكَ اللَّهمَّ لَبَّيكَ...**).

وقاسمی كوڕی محمد رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت : (**خرجَ معاويةُ ليلةَ النَّفرِ فسمعَ تلبيةٍ ، فقالَ : مَنْ هذا ، قالُوا : عائشةُ أُمَ المؤمنين رضي الله عنها اعتمرَتْ مِن التَّنعيمِ فُذكر ذلِكَ لعائشةَ رضي الله عها فقالَتْ : لو سألَنِي لأخبرْتُه**).

واته : موعاویه رضي الله عنه ئەو شەوەی بەیانییەکەی خەڵك بە لێشاو لە میناوە دەچن بۆ مەککە دەرچوو ، دەنگی تەلبییەکردنی بیست ، گوتی : ئەمە کێیە ؟ گوترا : عائیشەی دایکی باوەڕدارانە رضي الله عنها ، لە تەنعیمەوە عومرەی کردووە ، ئەوەیان بۆ عائیشە رضي الله عنها گێڕایەوە ، گوتی : ئەگەر پرسیاری لێکردبام ، باسی ئەوەم بۆ دەکرد .

١٨ . وپەیوەست دەبێت بە تەلبییە کردنەوە چونکە لە دروشمی حەجە (عومرە) ، ولەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((ما مِن ملبٍّ يلبِّي إلّا لبّى ما عن يمينِهِ وعن شمالِهِ من شجَرٍ وحجَرٍ حتّى تنقطعَ الأرضُ من هنا وَهنا - يعني - عن يمينِهِ وشمالِهِ)).

واته : هیچ کەسێك نییە تەلبیە بکات ، ئیللا دار وبەرد لای چەپ وڕاستیەوە تەلبیە دەکەن ، وبەتایبەت هەرکاتێك سەرکەوێتە

سەربەرزییەك یان خواربێتەوە بۆ شیوێك ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی پێشو : ((كَأَنِّي أَنْظُرُ إلى مُوسى ﷺ هابِطًا مِنَ الثَّنِيَّةِ ، وله جُؤارٌ إلى اللهِ بالتَّلْبِيَةِ)).

ولە فەرموودەیەكی تردا : ((كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ إذا انْحَدَرَ فِي الوادِي يُلَبِّي)).

واتە : وەك ئەوەی تێیدەڕوانم ، لە شیوێك خوار دەبێتەوە وتەلبیە دەكات .

١٩ . وبۆی هەیە تەلبیە و(لا إلـه إلا الله) تێكەڵ بكات ، لەبەر ئەو گوتەی ئیبن مەسعود رضي الله عنه كە دەڵێت : ((لقد خَرجتُ معَ رسولِ اللَّهِ ﷺ فما ترَكَ التَّلبيةَ ..... إلّا أن يخلِطَها بتَكبيرٍ أو تَهليلٍ)).

واتە : لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچووم تەلبیە كردنی واز لێ نەهێنا .... هەتاكو تەلبیەی لەگەڵ تەهلیل تێكەڵ نەكردایە .

٢٠ . ئەگەر گەیشتە حەرەمی مەککی ومالّەکانی شاری مەککەی بینی وازدەهێنێت لە تەلبییە کردن ، بۆ ئەوەی دەستی بەتالّ بێت وسەرقالّی کردەوەکانی تر بێت .

  

## خۆشۆردن بۆ چوونە نێو مەككە

٢١ . وهەركەسێك ئاسان بوو خۆی بشوات پێش ئەوەی بچێتە مەككەوە ، باخۆی بشوات وبە ڕۆژ بچێتە ژوورەوە بۆ نێو شاری مەككە ، وەك شوێنكەوتن بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ .

٢٢ . ولای سەرەوە بچێتە ژوورەوە كە ئەمڕۆ (باب المعلاة)ی لێیە ، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕێگای بەرزی (كداء) كە دەڕوانێتە سەرگۆڕستانەكە چووەتە نێو مەككەوە ، ولە دەرگای (بنو شيبة)وە چووەتە ژوورەوە بۆ مزگەوت ، چونكە ئەمە نزیكترین ڕێگایە بۆ بەردە ڕەشەكە .

٢٣ . وبۆی هەیە لە هەررێگایەکەوە بچێتە ژوورەوە بۆ نێو مەککە ، لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە دەفەرموێت : ((كلُّ فِجاجِ مكةَ طريقٌ ومَنْحَرٌ)).

واتە : هەموو رێگاکانی مەککە رێگای چوونە ژوورەوە وشوێنی سەربڕینی ئاژەڵانە .

ولە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت : ((مكَّةُ كلُّها طريقٌ : يدخلُ من ههنا ويخرجُ من هَهُنا)).

واتە : مەککە هەمووی رێگایە ، لێرەوە دەچێتە ژوورەوە ، ولێرەوە لە شار دەردەچێت .

٢٤ . ئەگەر چوویتە ژوورەوە بۆ مزگەوت بیرت نەچێت پێی ڕاستت پێش بخەیت وبڵێیت : ((اللَّهمَّ صلِّ على محمَّدٍ وسلَّم ، اللَّهمَّ افتح لي أبوابَ)).

یان : ((أعوذُ باللهِ العظيمِ ، وبوجهِهِ الكريمِ ، وسلطانِهِ القديمِ منَ الشيطانِ الرجيمِ)).

٢٥ . ئەگەر کەعبەی بینی ویستی دەستەکانی بەرز دەکاتەوە ، لەبەر ئەوەی جێگیر بووە لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما .

٢٦ . ولە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دوعایەکی تایبەت جێگیر نەبووە ، دەپاڕێتەوە بەوەی ئاسانە بۆی ، وئەگەر پاڕایەوە بەو پاڕانەوەی عومەر رضي الله عنه باشە : (اللَّهمَّ أَنت السَّلامُ ومنك السَّلامُ فحيِّنا ربَّنا بالسَّلامِ) ، لەبەر ئەوەی جێگیربووە لێیەوە .

  

## تـەواف

٢٧ . پاشان دەستپێشخەری دەكات بۆ چوون بۆ لای بەردە ڕەشەكە ، وڕووی تێدەكات و(الله أكبر) دەخوێنێت ، و(بسم الله) خوێندن پێش (الله أكبر)ەكە به صەحیحی لـه ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما هاتووە ، وهەركەسێك بە فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ باسی ئەوەی كردووە هەڵەی كردووە .

٢٨ . پاشان به دەستی ڕاستی دەست لـه بەردە ڕەشەكە دەدات وماچی دەكات ، وسوژدەی لـەسەر دەبات ، پێغەمبەری خودا ﷺ وعومەر وئیبن عەباس رضي الله عنهما بەوشێوەیان كردووە .

٢٩ . ئەگەر نەیتوانی ماچی بكات ، به دەستی دەیگرێت ، پاشان دەستی ماچ دەكات .

٣٠ . ئەگەر نەیتوانی دەستی پێدا بهێنێت ، به دەستی ئاماژەی بۆ دەکات.

٣١ . ولـه هەموو تەوافەکەیدا ئەمه ئەنجام دەدات .

٣٢ . وپاڵ پاڵێن ناکات بۆ ئەوەی بگاته بەرده ڕەشەکه ، لـەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ که دەفەرموێت : ((يا عمرُ إنَّكَ رجلٌ قويٌّ ، فلا تؤذِ الضَّعيفَ ، وإذا أردتَ استلامَ الحجرَ ، فإنْ خَلا لك فاستلِمْهُ ، وإلّا فاستقبِلْهُ وكبِّرْ)).

واته : ئەی عومەر تۆ پیاوێکی بەهێزیت ، ئازاری کەسی لاواز مەدە ، وئەگەر ویستت دەستت بگات به بەرده ڕەشەکه ، لای چۆڵ بوو دەستی لێبده ، وئەگەر چۆڵ نەبوو ڕووی تێبکه و(الله أكبر) بخوێنه .

٣٣ . ودەست لێدانی بەرده ڕەشەکه فـەزڵێکی گـەوره هەیـه ، به بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفـەرموێت :

((لَيَبعَثَنَّ اللهُ الحَجَرَ يومَ القيامَةِ ولَه عَينانِ يُبصِرُ بهما ، ولِسانٌ يَنطِقُ به ويَشهَدُ على مَنِ استَلَمه بحقٍّ)).

واتە : خودا ﷻ حەجەری ئەسوەد لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکاتەوە وژیانی بە بەردا دەکات ، ودوو چاوی هەیە پێی دەبینێت ، وزمانێکی هەیە قسەی پێ دەکات ، وگەواهی دەدات بۆ هەرکەسێك دەستی لێدابێت بە حەق .

ودەفەرموێت : ((مسحَ الحجرِ الأسودِ ، والركنَ اليمانيِّ ، يَحُطّانِ الخطايا حطًّا)).

واتە : دەست هێنان بە بەردە ڕەشەکە ، وڕوکنی یەمانی ، تاوان دەوەرێنن وهۆکاری لێخۆشبوونن .

ودەفەرموێت : ((الحجرُ الأسودُ من الجنةِ وكان أشدَّ بياضاً من الثلجِ حتى سوَّدته خطايا أهلِ الشركِ)).

واته : بەردە ڕەشەکە لە بەهەشتەوەیە ، ولە بەفر سپی تر بوو ، هەتاکو تاوانەکانی هاوبەش بڕیاردەران ڕەشیان کردەوە .

٣٤ . پاشان تەواف بە دەوری کەعبەدا دەست پێدەکات وکەعبە دەخاتە لای چەپی ، وتەواف دەکات لە پێشی بەردە ڕەشەکەوە ، لە بەردەکەوە بۆ بەردەکە شەوتێکە ، ولە هەموو شەوتەکاندا (اظطباع)[٢] دەکات ، ولە سێ شەوتی یەکەم بە هەروەلە لە بەردە ڕەشەکەوە بۆ بەردە ڕەشەکە دەسوڕێتەوە ، ولە شەوتەکانی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی دەسوڕێتەوە .

٣٥ . ولە هەموو سوڕانەوەی تەوافەکەی دەست دەهێنێت بە ڕوکنی یەمانیدا ، وماچی ناکات ، وئەگەر نەیتوانی دەستی پێدا بهێنێت ، ئاماژە بۆ کردنی شەرعی نییە .

---

(٢) . الاضطباع : بریتییە لەوەی ئەو پارچەی بەشی سەرەوەی لاشەی پێدا دەپۆشێت بخاتە ژێر باڵی ڕاستی ، وبیگەڕێنێتەوە بۆ لای چەپی ، وشانی ڕاستی دەربخات ، وشانی چەپی دابپۆشێت ، ئەوە پێش ئەم تەوافە ودوای ئەم تەوافە بیدعەیە .

٣٦ . ولە نێوان ڕوکنی یەمانی وبەردە ڕەشەکە ئەم دوعایە دەخوێنێت : ((رَبَّنا آتِنا في الدُّنْيا حَسَنَةً وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً ، وَقِنا عَذابَ النّارِ)).

٣٧ . وهەردوو ڕوکنە شامییەکە دەست پێدا ناهێنێت ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی پێدا نەهێناون .



## خۆنووسان بە دیواری کەعبەوە لە نێوان ڕوکنی بەردە ڕەشەکە ودەرگای کەعبە

٣٨ . ودەتوانێت خۆی بە دیواری کەعبەوە بنوسێنێت لە نێوان ڕوکنی بەردە ڕەشەکە ودەرگای کەعبە ، وسنگ وڕوخسار وقۆڵەکانی بە دیواری کەعبەوە بنوسێنێت ، ئیبن تەیمییە دەڵێت : ئەگەر ویستی دەچێتە (الملتزم) کە نێوان بەردە ڕەشەکە ودەرگای کەعبەیە ، سنگ وڕوخسار وقۆڵەکان ولەپی دەستەکانی دەخاتە سەر دیواری کەعبە ، ودوعا دەکات ولە خودا داوای پێداویستی دەکات ، ... وهاوەڵان کاتێك دەچوونە مەککە ئەوەیان دەکرد ... وئەگەر لای دەرگاکەش بوەستێت لەوێ بپاڕێتەوە بەبێ ئەوەی خۆی بە دیواری کەعبە بنوسێنێت ئەوەش باشە ، ئەگەر ڕۆیشت ناوەستێت ولاناکاتەوە وبەرەو دواوە ناڕوات .

٣٩ . وتەواف زیکری تایبەتی نییە ، بۆی هەیە قورئان یان ئەو زیکرەی دەیەوێت بیخوێنێت ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە دەفەرموێت : ((**الطوافُ بالبيتِ صلاةٌ ، ولكِنَّ اللهَ أحلَّ فيه النطق ، فمَنْ نطقَ فلا يَنطِقُ إلّا بخيرٍ**)) **وفي رواية :** ((**فأقِلُّوا فيهِ الكلامَ**)).

واتە : تەوافی کەعبە نوێژە ، بەڵام خودا قسەکردنی تێدا حەڵاڵ کردووە ، هەرکەسێك قسەی کرد باجگە لە قسەی خێر نەکات ، ولە ڕیوایەتێکدا : قسەی کەمی تێدا بکەن .

٤٠ . ودروست نییە کەسێك پۆشاکی لەبەر نەبێت وڕووتبێت یان ئافرەت کە لە سوڕی مانگانەدابێت تەوافی کەعبە بکات ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**لا يَطُوفَ بالبَيْتِ عُرْيانٌ**)).

واتە: کەسێ پۆشاکی لەبەر نەبێت وڕووت بێت تەوافی کەعبە نەکات.

وئەو فەرموودەیەی کە لە عومرەی حەجی ماڵئاوایدا بە عائیشەی ﵂ فەرموو : ((**افْعَلِي كما يَفْعَلُ الحاجُّ غيرَ أَنْ لا تَطُوفي بالبَيْتِ [ولا تُصَلِّي] حتّى تَطْهُرِي**)).

واتە : هەموو ئەوەی حاجی ئەنجامی دەدات ئەنجامی بدە ، بەڵام تەوافی کەعبە ونوێژ مەکە هەتاکو لە سوڕی مانگانە پاك دەبیتەوە .

٤١ . ئەگەر شەوتی حەوتەمی کۆتایی پێهێنا ، شانی ڕاستی دادەپۆشێت ، ودەچێت بۆ لای مەقامی ئیبراهیم ، وئەم ئایەتە دەخوێنێت : ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ ١٢٥﴾(البَقَرَة).

واته : لای ئەو بەردە "کە جیٚ پێی پێغەمبەر ئیبراهیمە عليه السلام وەدەچووە سەری بۆ بیناکردنی کەعبە دوای بەرزبوونەوەی دیوارەکانی" بکەنە جیٚ نوێژ .

٤٢ . ومەقام دەخاتە نێوان خۆی وکەعبەوە ولەوێدا دوو ڕکات نوێژ دەکات .

٤٣ . ولەو دوو ڕکاتەدا : ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ، و﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێنێت .

٤٤ . ونابێت کەس لە کەعبەدا بە پێش دەستی نوێژخوێندا بڕوات ، ونوێژخوێن ڕێگا نەدات لە کاتێکدا نوێژ دەکات کەس بە پێش دەستیدا بڕوات ، لەبەر گشتگیری ئەو فەرموودانەی نەهییان لەوە کردووە ، وجێگیر نەبوونی جیاکردنەوەی مزگەوتی حەرام لەو نەهییە ، بەڵکو ئەو نەهیکردنە هەموو مەککەش دەگرێتەوە .

٤٥ . پاشان ئەگەر نوێژەکەی بە کۆتا هێنا ، دەچێت بۆ لای زەمزەم وئاوی لیٚ دەخواتەوە ، ولێی دەکات بەسەریدا ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((ماءُ زَمْزَمَ لِما شُرِبَ له)).

واتە : ئاوی زەمزەم بۆ هەرمەبەستێك بخورێتەوە ، بەویستی خودا بۆی مەیسەر دەبێت .

ودەفەرموێت : ((إنَّها مبارَكةٌ وَهيَ طعامُ طُعمٍ [وشفاءُ سُقمٍ])).

واتە : ئاوی زەمزەم ئاوێکی موبارەکە ، خۆراکە بۆ برسی ، وچارەیە بۆ نەخۆشی .

ودەفەرموێت : ((خيرُ ماءٍ على وجهِ الأرضِ ماءُ زمزمَ ، فيه طعامٌ من الطُّعْمِ ، وشفاءٌ من السُّقْمِ)).







واته : باشترین ئاو لەسەر ڕووی زەوی ئاوی زەمزەمە ، خۆراکە بۆ برسی ، وچارەیە بۆ نەخۆشی .

٤٦ . پاشان دەگەڕێتەوە بۆ بەردە ڕەشەکە ، (الله أكبر) دەکات ودەست دەهێنێت بە بەردە ڕەشەکەدا ، بەو شێوەیەی پێشتر بە درێژی باسکرا .

  

## هاتوچۆی نێوان سەفا ومەروە

٤٧ . پاشان دەگەڕێتەوە بۆ هاتوچۆی نێوان سەفا ومەروە ، ئەگەر نزیکبوویەوە لە سەفا ، ئەم فەرموودەیەی خودا ﷻ دەخوێنێت : ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾﴾(البَقَرَة) ، ودەڵێت : ((**نَبْدَأُ بِما بَدأَ اللهُ بِهِ**)).

واتە : بە دڵنیاییەوە سەفا ومەروە لە دروشمەکانی خودان هەرکەس حەجی کرد یان عومرەی کرد هیچ گوناهی ناگات بە هۆی ئەوەی کە هاتوچۆی نێوان ئەو دوو کێوە بکات کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی کەعبەوە ، وهەرکەس خێر وچاکەی زیاتر ئەنجام بدات خودا سوپاسی دەکات وپاداشتی بە چەند هێندە دەداتەوە ، چونکە

بێگومان خودا سوپاسگوزارە وزانایە بەو کردەوانە ؛ بەوە دەست پێدەکەین کە خودا دەستی پێکردووە .

٤٨ . پاشان بە کێوی سەفا دەست پێ دەکات ، وسەردەکەوێت بەسەریدا هەتاکو کەعبە دەبینێت .

٤٩ . ڕوو دەکاتە کەعبە ، خودا بە تاك وتەنها دادەنێت و(الله أكبر) دەخوێنێت ودەڵێت : ((اللهُ أكبرُ ، اللهُ أكبرُ ، اللهُ أكبرُ ثلاثا ، لا إله إلّا اللّهُ وحْدَهُ ، لا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ المُلْكُ ، ولَهُ الحَمْدُ ، يُحْيِي وُيمِيتُ ، وهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِير ، لا إلهَ إلّا اللّه وحْدَهُ لا شريكَ لَهُ ، أنْجَزَ وعْدَهُ ، ونَصَرَ عَبْدَهُ ، وهَزَمَ الأحْزابَ وحْدَهُ)) ، يقول ذلك ثلاث مرات ويدعو بَيْنَ ذلِكَ .

واتە : سێ جار (الله أكبر) دەخوێنێت ، وسێ جار ئەو دوعایە دەخوێنێت ، ولە نێوان ئەوەدا دەپاڕێتەوە .

٥٠ . پاشان دادەبەزێت بۆ هاتوچۆی نێوان سەفا ومەروە ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((اسعوا فإنَّ اللهَ كتبَ عليْكمُ السَّعيَ)).

واتە : هاتوچۆ بکەن لە نێوان سەفا ومەروەدا ، چونکە بێگومان خودا ﷻ ئەوەی لەسەر فەرز کردوون .

٥١ . بە ڕۆیشتن دەڕوات هەتاکو دەگاتە ئەو نیشانەیەی لای ڕاست وچەپەوە دانراوە کە ناسراوە بە (میلە سەوزەکە) ، پاشان بە خێرایی دەڕوات هەتاکو دەگاتە ئەو نیشانەی دوای ئەوە دانراوە ، لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ شیوێکی فراوان بوو وردە بەرد وزیخی تێدابوو ، ودەفەرموێت : ((لا يُقْطَعُ الأَبْطَحُ إلّا شَدًّا)) .

واتە : پانتایی ئەو شیوە بە ڕاکردن نەبێت نابڕێت .

پاشان به ڕۆیشتن دەڕوات هەتاکو دەگاتە مەروە وسەردەکەوێت بەسەریدا ، وئەوەی لەسەر سەفا ئەنجامیدا لەسەر مەروەش دووبارەی دەکاتەوە ، لە ڕووکردنە قیبلە و(الله أکبر) وبە تاك وتەنها دانانی خودا ودوعا کردن ، وئەمە شەوتێکە .

٥٢ . پاشان دەگەڕێتەوە هەتاکو سەردەکەوێت بەسەر سەفادا ، دەڕوات لەو شوێنانەی شوێنی ڕۆیشتنە ، وڕا دەکات لەو شوێنانەی شوێنی ڕاکردنە ، وئەمە شەوتی دووەمە .

٥٣ . پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مەڕوە ، وبەو شێوەیە هەتاکو حەوت شەوت تەواو دەکات ، کە کۆتاییەکەی لەسەر مەروەیە .

٥٤ . ودروستە هاتوچۆ بکات لە نێوانیاندا بە سواری ، وپێغەمبەری خودا ﷺ پیادەیی پێی خۆش بووە .

٥٥ . ئەگەر پاڕایەوە بەم نزایە : (ربِّ اغفِرْ وارْحَمْ وأنت

الأعَزُّ الأكرمُ) ، لـه كاتی هاتوچۆی نێوان سەفا ومەروە ئاساییە ، لەبەر جێگیر بوونی لـه کۆمەڵێك لـه سەلەفەوە .

٥٦ . ئەگەر شەوتی حەوتەمی لەسەر مەروە کۆتایی پێهێنا ، سەری دەتاشێت یان قژی کورت دەکاتەوە ، بەوەش عومرەکەی کۆتایی دێت ، وهەموو ئەوەی بە هۆی ئیحرامەوە لەسەری حەرام بوو بۆی حەڵاڵ دەبێتەوە .

  

## سەرتاشین یان کورت کردنەوەی

٥٧ . پاشان هەموو سەری دەتاشێت یان کورتی دەکاتەوە ، ویەکەمیان باشترە ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((اللَّهُمَّ ارْحَمِ المُحَلِّقِينَ ؛ قالوا : والْمُقَصِّرِينَ يا رَسولَ اللهِ ، قالَ : اللَّهُمَّ ارْحَمِ المُحَلِّقِينَ ؛ قالوا : والْمُقَصِّرِينَ يا رَسولَ اللهِ ، [فَلَمّا كانَتِ الرّابِعَةُ ، قالَ : والْمُقَصِّرِينَ])).

واتە : پەروەردگارا ڕەحم بەوکەسانە بکە کە سەریان دەتاشن ، گوتیان : ئەوانەش قژیان کورت دەکەنەوە ئەی پێغەمبەری خودا ؟ ، فەرمووی : پەروەردگارا ڕەحم بەوکەسانە بکە کە سەریان دەتاشن ، گوتیان : ئەوانەش قژیان کورت دەکەنەوە ئەی پێغەمبەری خودا ؟ لە جاری چوارەمدا فەرمووی : وئەوانەشی کە قژیان کورت دەکەنەوە .

٥٨ . وسوننەتە سەرتاشەکە بە لای ڕاستی سەری ئەو کەسە دەست پێ بکات کە سەری دەتاشێت ، ئەوە لە فەرموودەی ئەنەسدا رضي الله عنه هاتووە .

٥٩ . وسەرتاشین تایبەتە بە پیاوانەوە وئافرەتان ناگرێتەوە ، بەڵکو ئافرەتان پێویستە لەسەریان قژیان کورت بکەنەوە ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە دەفەرموێت : ((ليس على النِّساءِ الحَلْقُ ؛ إنَّما على النِّساءِ التَّقصيرُ)).

واتە : ئافرەتان سەرتاشینیان لەسەر نییە ، بەڵکو کورت کردنەوەی قژیان لەسەرە ؛ قژی کۆ دەکاتەوە وبە ئەندازەی سەرپەنجەیەکی لێ کورت دەکاتەوە .

٦٠ . ولە مەککە دەمێنێتەوە چەند خودا بۆی نوسیبێت ، وباپێداگربێت لەسەر بەجێهێنانی نوێژ بە کۆمەڵ ، بە تایبەت لە مزگەوتی حەرام ، لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە فەرموێت : ((صَلاةٌ في مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِن أَلْفِ صَلاةٍ فِيما

سِواهُ ، إلّا المَسْجِدَ الحَرامَ ، وصلاةٌ في المسجدِ الحرامِ أفضلُ من مئةِ ألفِ صلاةٍ فيما سواه)).

واتە : نوێژێك لە مزگەوتەكەم باشترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەكانی تر جگە لە مزگەوتی حەرام ، ونوێژێك لە مزگەوتی حەرام باشترە لە سەد هەزار نوێژی مزگەوتەكانی تر .

٦١ . وزۆر تەواف ونوێژ دەكات هەركاتێك لە شەو یان ڕۆژ ویستی ، ولەبەر ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی ڕوكنی بەردە ڕەشەكە وڕوكنی یەمانی كە دەفەرموێت : ((مسحهما يحط الخطايا ، ومن طاف بالبيت لم يرفع قدما ولم يضع قدما إلا كتب الله له حسنة وحط عنه خطيئة وكتب له درجة ، ومن أحصى أسبوعا كان كعتق رقبة)).

واتە : دەستهێنان بە ڕوكنی بەردە ڕەشەكە وڕوكنی یەمانی ، تاوانەكان دەوەرێنن ، وهەركەسێك تەواف بە دەوری كەعبەدا

بكات ، پێیەك بەرز ناكاتەوە ، وپێیەك دانانێت ، ئیللا خودا چاكەیەكی بۆ دەنوسێت ، وتاوانێكی لەسەر دەسڕێتەوە ، وپلەیەكی بۆ دەنوسێت ، وهەركەسێك حەفتەیەك تەواف بكات وەك ئازاد كردنی بەندەیەك وایە .

ودەفەرموێت : ((يا بَنِي عَبْدِ مناف ، لا تَمْنَعُوا أحَدًا طافَ بِهَذا البَيْتِ وصلى أيَّة ساعَةٍ شاءَ ، مِن لَيْلٍ أوْ نَهارٍ)).

واتە : ئەی نەوەكانی عەبدی مەناف ، ڕێگری لە هیچ كەسێك مەكەن كە تەوافی ئەمماڵە بكات ، وهەركاتێك بیەوێت نوێژ بكات ، لە شەو یان ڕۆژ .

٦٢ . ئەگەر تەوافی كۆتایی پێهێنا ولە مزگەوت دەرچوو ، پێی چەپی پێش دەخات ، ودەڵێت : ((اللَّهمَّ صلِّ على محمَّدٍ وسلَّم ، اللَّهُمَّ إنِّ أسْأَلُكَ مِن فَضْلِكَ)).

٦٣ . وبۆی هەیە ئەوەندەی دەتوانێت ئاوی زەمزەم بۆ تەبەڕوك

لەگەڵ خۆیدا بباتەوە ، چونکە : ((**كانَ رسولُ اللهِ ﷺ يحمله في الأداوي والقِرَبِ ، وكان يَصُبُّ على المَرْضى ويَسقيهم**)) .

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ لە قاپی لە چەرم دروستکراو ومەشکەدا ئاوی زەمزەمی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت ، دەیکرد بەسەر نەخۆشدا وپێیدەدان لێی بخۆنەوە .

بەڵکو : ((**كان يرسل وهو بالمدينة قبل أن تفتح مكة إلى سهيل بن عمرو ؛ أن : أهد لنا من ماء زمزم ، ولا تترك ؛ فيبعث إليه بمزادتين**)).

واتە : پێغەمبەری خودا ﷺ لە مەدینە پێش ئەوەی مەککە فەتح بکرێت پەیامی دەنارد بۆ سوهەیلی کوڕی عەمر دەیفەرموو : ئاوی زەمزەممان بە دیاری بۆ بنێرە ولەسەر ئەوە بەردەوامبە ، سوهەیل : دوو مەشکە ئاوی زەمزەمی بۆ نارد .

  

# ناوەڕۆک

